


# چیرۆكی منالآن

## ئامادەكردنی: یاسین بانیخێلانی

### سەرەتایەكی پێویست

ئەو كاتانەی سەرقاڵی كاری پەروەردە بووم، چیرۆكی زۆر بەتام و چێژی منالآنم بەهۆی كارەكەمەوە دەخوێندەوە. یەكێك لەو چیرۆكانە ئەم چیرۆكە بەناوبانگەیە، كە دەتوانم بلّێم: بۆ زۆربەی زمانە زیندووەكانی جیهان وەرگێڕدراوە، جگە لەوەی چەندین جار كراوە بە فیلم. من لێرەدا نامەوێت باسی ناوەڕۆكی چیرۆكەكە بكەم، كە هەر ڕستەیەكی چەندین پەندی تێدایەو پرسیار لەلای منالّ دروست دەكات. بەڵكو دەمەوێت سەرنجی خوێنەر بۆ لای ئەوە ڕابكێشم، بۆچی نووسیومە ئامادەكردن، نەك وەرگێڕان! سەرەتا ئەم چیرۆكەم لە نامیلكەیەكدا لەژێر ناوی (هایدی)دا خوێندەوە، كە ناوی نووسەری لەسەر نەبوو، پاشان لە (كتێبخانەی شار)ی ئەم شارە نامیلكەیەكم لە ژێر هەمان ناودا بینی بە بێ ئەوەی ناوی نووسەری لەسەر بێت، جگە لەوەی دوو جار بە فیلم ئەم چیرۆكەم بینووە، كە لە یەكێكیان ئاماژەی بە ژنە نووسەری سویسری یوهەنا شپیر*1كردبوو، منیش بۆ ئەوەی بگەمە ئەو ئاكامەی، كە ئایا بەڕاستی یۆهەنا شپیر خاوەنی ڕاستی چیرۆكەكەیە سەردانی ئەم سایتە سویسرییەم كرد (www.heidi01.ch) بۆم ڕوونبووەوە، كە نووسەری ڕاستی ئەم چیرۆكە خانم یۆهەنایەو سەدو بیست ساڵ پێش ئێستا ئەم چیرۆكەی نووسیوە، بەڵام بەهۆی چەندین جار نووسینەوەو بە فیلم كردن، ناوی نووسەرەكە كەم تا زۆر ونبووە. بەهەرحاڵ

منیش هەمان کارم کردو لەکۆی هەموویان ئەم چیرۆکەم دروستکرد، کە هەمان چیرۆك و هەمان ناوەڕۆکە، بەڵام بە زمان و داڕشتنێکی سادەتر. لەکۆتاییدا ئەوەی گرنگە بێلێم: وەك ئامانەت و مەسەلەیەکی ئەخلاقی لەنووسیندا ناوەکان لەبەر قورسیان بۆ منداڵانی کورد گۆڕی بۆناوی ئاسانترو چیرۆکەکەم کورت و چڕ کردەوە، بە بێ ئەوەی یەك گەرد لە بایەخ و گرنگی چیرۆکە ئۆرگینالەکە کەم بکەمەوە، بۆیە هیوادارم نەك خزمەتێکم کردبێت، چونکە بە ئەرکی خۆمی دەزانم تەنهاو تەنها توانیبێتم بەم چیرۆکە دڵی منداڵانی کورد ڕازی بکەم.

# هایدی



بە ماندووی هایدی بۆ لای پورە دێتە بە تولە ڕێگای کێوەکەدا هاتە خوارەوە. ئەو دەیوویست سەردانی باپیری بکات، کە لە کۆلێتێکدا لەسەر کێوەکە دەژیا.

– تۆ ماندوویت هایدی؟ (پورە دێتە پرسی).

– نا، تەنها گەرمامە. (هایدی وەڵامی دایەوە)

ئەمە هیچ سەرسوڕهێنەر نییە بۆ ڕۆژێکی هاوین، چونکە هایدی بەرگی زستانانەی لەبەردابوو، لەگەڵ گۆرەوی ئەستوری خوری و جزمەی لە پێ هەڵکێشا بوو، وە شاڵێکی سوری ئەستوریشی ، بۆ ئەوەی سەرمای نەبێت لە ملی ئاڵاندبوو. پورە دێتە بڕیاری دابوو، کە بە ئاسانی ئەو جلانەی لە جێگایەکدا پێ دابکەنێت و لەگەڵ هەندێ شتی تردا وەك بوخچەیەك بە دەست هەڵی بگرێت.

لەناکاو هایدی کوڕێکی یانزەساڵانەی بینی، کە بزگەلێکی بۆ لای ئەوان دەهانی. ئەو بە کراسێکی تەنك و دەرپێ کورتێکەوەو بە پێ خاوسی لەو ناوەدا بەدەم لەوەڕاندنی بزنەکانەوە باز بازێنی بوو.



هایدی دانیشت و شاڵەکەی لە ملی کردەوەو هە موو جلەکانی بەری فڕێ دا بەتەنها ژێر کراسە قۆڵ کورتەکەی نەبێت.

– ئەو بزنانە بۆ کوێ دەبەیت؟. بە هەناسە بڕکەوە

– بەرەو سەر شاخەکە، لە کوێ لەوەڕی باشی لێبێت! بە خەندەیەکەوە پێتەری شوان.

پاش کەمێك گەڕانەوە بۆ ئەو خانووەی، کە پێتەر لەگەڵ دایکی و داپیرەی تێیدا دەژیان. پورە دێتەو هاوڕێکانیشی لەبەردەم دەرگاکە لە چاوەڕوانیدا وەستابوون.

– هایدی ئەوە چیت لێهات؟ ئەوە جلەکانت کوان؟ پورە دێتە بە ترسەوە گوتی.

"لە خوارەوەیە" هایدی ئەمەی گوت و ئاماژەی بۆ دامێنی کێوەکە کرد.

پێتەر پێکەنی، بەڵام کاتێك پورە دێتە دراوێکی بەدیاری پێدا، بەرەو دامێنی کێوەکە هەڵهات بۆ هێنانەوەی بوخچە جلەکە.

ماڵی باپیرە کەوتۆتە سەرەوەلە بەرزایی کێوەکە، ئەو بەم ڕۆژگارە لەسەر کورسیی بەردەم کۆڵێتەکە لەبەر هەتاودا ڕادەکشێت. ، ئەوکورسیەی کە ئێستا لەسەری دانیشتووە.



هایدی بەرەو ڕووی پیاوە پیرەکە هەڕای کردو ڕایچڵەکاند، کاتێك توند دەستەکانی گرت و گوتی: بەیانیت باش باپیرە!.

– ئەمە چی مانایەکی هەیە؟. باپیرە کوتوپڕئەم پرسیارەی کرد.

– هایدی گوتی: ئێستا پورە دێتە دێت.

– ئەوە کوڕەزاکەتم هێناوەتەوە، کە لە تەمەنی یەك ساڵییەوە نەتبینیوەتەوە.

– ئەی بۆچی ئێستا هێناوتەوە بۆ ئەم بەرزاییە بۆ لای من ؟.

– ئەم کیژۆڵە دەبێت لای تۆ بمێنێتەوە، لەوەتەی دایك و باوکی مردوون من بەخێوی دەکەم، بەڵام ئێستا کارێکم لە فرانکفورت بۆ پێشنیاز کراوەو ناتوانم لەگەڵ خۆمدا بیبەم.

– ئێ چۆن بتوانم ئێستا لەگەڵیدا هەڵسوکەوت بکەم، ئەگەر لە شوێنی تۆ گریا؟. باپیرە ئەم پرسیارەی کردو بینی پورە دێتە زۆر نارەحەتە.

– دەبێت تۆ یەکێکی تری بۆ پەیدا بکەیت، کە خەمی بخوات، من دەبێت بڕۆم، خوات لەگەڵ هایدی. ئەمەی گوت و بە پەلە بەرەو بناری چیاکە کەوتە ڕێ.

کۆڵیتەکەی باپیرە تەنها یەك ژووری سەربەخۆ بوو، کورسی و مێزێك لە ناوەڕاستیدا دانرابوو، لەتەنیشت دیوارەکە بەرامبەر بە سۆپادارینەکە جێگای نووستنەکەشی لێبوو، بە دیوارەکانیشیدا چەند چراو لەمپا هەڵواسرابوون.

– باپیرە، من لە کوێدا دەتوانم بخەوم؟ هایدی پرسی.

– لە کوێ خۆت دەخوازیت.

هایدی بەمە خۆشخاڵ بوو، بە هەموو گۆشەو کون و قوژبنێکیماڵەکەدا گەڕا، هەتا پەیژەیەکی دۆزییەوە، کە سەردەکەوت بۆ ناو کادانەکە، ئەویش بەپەلە خۆی خزاندە سەرەوە، بینی لەگەڵ ئەوەی جێگایەکی زۆر نەرمە، (گزرە)*1 کەش بۆنێکی خۆشی لێوە دێت.

" باپیرە من دەمەوێت لێرە لەم بانە بخەوم" گزرەکەی بۆ لای ڕاست پاڵناو گوتی: من تەنها چەرچەفێکم دەوێت بەسەری خۆمیدا بدەم.

باپیرەی ڕۆشت بۆ لای دۆڵابەکەو دوو پارچە قوماشی نەرم، کە ئەو بتوانێت یەکێکیان ڕابخاو یەکێکیان بە خۆدا بدات پەیداکرد.

" من ئێستا هیوا ئەخوازم شەو زوو بێت و لەسەر ئەم گزرە بخەوم" هایدی وا گوت.

– بڕوام وایە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پێکەوە شتێك بخۆین. باپیرە وەڵامی دایەوە پێکەوە لەسەر مێزەکە دانیشتن و نان و پەنیریان دەخواردو لەناو زەرکێکی*2 گەورەدا شیری بزنیشیان دەخواردەوە.



دوا نیوەڕۆیەکی درەنگ هایدی گوێی لە دەنگی زەنگۆڵە بوو، کاتێك بزنەکان بەپەلە دەهاتنەوەو پێتەریش لەناوەڕاستیاندا بوو. بزنەکان گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، لەبەردەم کۆڵیتەکەدا مانەوە جگە لە دوو ئاژەڵی جوان، کە یەکێکیان سپی و ئەوتریان قاوەیی نەبێت بەرەو لای باپیرە ڕۆیشتن و دەستیان دەلێسایەوە.

– باپیرە ئەمانەش هی خۆمانە؟. هایدی پرسی.

– بەڵێ،

بزنەکانیش بەردەوام ئەو خوێیەی ناو لەپی باپیرەیان دەلێستەوە.

هایدیش ڕۆیشت زەرکێکی هێناو باپیرەش دەستی بە دۆشینی بزنە سپیەکە کرد، بەڵام ئەوەندەی نەبرد دەفرەکە لێوان لێو بوو. هایدی ئەوە بەسە بڕۆ پارچەیەك سەمونیش بهێنە. "ئەمە شێو*3ی تۆیە.

" ناوی ئەم بزنانە چییە؟ هایدی دەیەوویست بزانێت.

– سپییەکە ناوی قازی چکۆلەیەو قاوەییەکەش ناوی ورچی چکۆلەیە.

– شەوباش باپیرە، ئەمەی بەدەنگی بەرز گوت و ڕۆیشت خۆی خزاندە سەربانەکەو پاش



کەمێك خەوی لێکەوت.

بۆ سبەینێ هایدی لەدەنگی زەنگۆڵە بە ئاگاهات. لە جێگاکەی خۆی دەرپەڕی و هاتە خوارەوە بینی وا پێتەر هات.

هەموو بەیانییەك پێتەر بزگەلی جوتیارەکە دەبات بۆ لەوەڕاندن، لەبەرامبەر ئەمەشدا پارەیەکی کەم وەردەگرێت.

باپیرە هەردوو بزنەکەی لە گەوڕەکە وەدەرخست بۆ لای بزنەکانی تر.

" دەتەوێت لەگەڵیاندا بێیت؟" پێتەر لە هایدی پرسی.

هایدی لە خۆشیاندا شاگەشکە بوو، گورج شوێنیان کەوت بۆ ئەودیوی چیاکە.

پێتەر لە پشتەوە بزگەلەکەی مۆڵدا، تا ئەو کاتەی لەسەر سەوزاییەکە پاڵکەوتن، پێتەرو هایدیش پێکەوە دانیشتن و دەستیان بە تاشتی*4 کرد. هایدی هەرزوو تێری خوارد، بۆیە سەمون و پەنیرەکەی خۆی دا بە پێتەر، چونکە ئەو هەمیشە برسی بوو.

بەدرێژایی ڕۆژ هایدی خۆی فێری ناوی هەموو بزنەکان کرد: تورکی گەورەو بەفرۆکەو زۆر ناوی تر...

ئێوارە پاش ئەوەی هەتاو ئاوابوو، چاوەکانی خەمێکیان پێوە دیار بوو، بۆیە بانگی پێتەری کرد:

پێتەر.. پێتەر سەیرکە هەموو شتێك ئاگری گرت، هەموو کێوەکەش ئەسوتێ!



– نا، ئەوە ئاگر نییە، پێتەر بەپێکەنینێکەوە، ئەوە ڕەنگی هەتاوە، ئێرە هەموو ئێوارەیەك ئاوایە.

دوای ئاوا بوونی هەتاوو توانەوەی ڕەنگەکان، پێتەر گوتی: دەبێت ئێستا بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێك گەشتنەوە کۆڵێتەکەی باپیرە، پێتەر پرسی: سبەینێ جارێکی تر لەگەڵما دێیتەوە؟. ئاخر

پێتەر لەگەڵ هایدا زۆر بەختەوەر بوو، چونکە ئەو زۆر چالاکانە یارمەتی دەدات تا بزنەکان بکەنە ناو گەوڕەکە، جگەلەمەش بەوە خۆشحاڵ بوو، کە کەمێك خواردنی بۆ بهێنێت.

بە درێژایی رۆژانی هاوین هایدی چ لە کێوەکەو چی بۆ کردنە ناو گەوڕ یارمەتی پێتەری دا، بەڵام پاش هاتنی پاییز وپاشان زستان، کە دەرەوە تەڕو سارد دەبوو. کەس نەیدەتوانی بەتەواوەتی رۆژ لەدەرەوە بمێنێتەوە، پێتەریش دەبوایەت بچێتە قوتابخانە، ئیتر نەیاندەتوانی یەکتر ببینن تا رۆژێکی یەکشەممە، کە بەفریکی زۆر باری بوو، پێتەر لەدەرگای کۆڵیتەکەی باپیرەی دا. پاش ئەوەی هەر سێکەیان بەئاسودەیی لەبەردەم سۆپاکەدا دانیشتبوون، باپیرە پرسی:



– ها جەنەراڵ، چییە سەربازەکانت لەدەست داوە، یا دەبێت ئێستا بۆ جارێکی تر خەمی کاغەزو قەڵەم بخۆیت؟.
– بۆ دەبێت ئەو وابێت؟ هایدی بە تاسەوە پرسی
– لە زستاندا دەبێت ئەو فێری خوێندنەوەو نووسین ببێت، باپیرەی ئەمەی روونکردەوەو گوتی: ئەمە زۆر سەختە یا نا جەنەراڵ؟
– وایە ئەمە راستە، پێتەر رازی بوونی خۆی نیشان بۆ قسەکانی.

پاش نان خواردن هایدی یەك دونیا پرسیاری سەبارەت بە قوتابخانە لە پێتەر کرد....

کاتێك پێتەر دەبوایەت بۆ ماڵەوە بگەڕێتەوە، گوتی: یەکشەممەی داهاتوو دێمەوە بۆ ئێرەو داپیرەم دەیگوت: دەبێت تۆش بۆ جارێك سەردانمان بکەیت.

دوای ئەم قسەیە ئیتر هەموو رۆژێك هایدی دەیگوت: من دەبێت بچمە خوارەوە سەردانی داپیرەی پێتەر بکەم، چونکە چاوەڕوانە.

باپیرەشی هەموو جارێك وەڵامی دەدایەوە، کە بەفر زۆر باریوەو هەموو شوێنێك هەر بەفرە تا رۆژێکیان، کە بەتەواوەتی بەفرەکە رەق بوو بوو باپیرەی رۆیشت سەرسەرە*5 یەکی هێناو بانگی کرد: وەرە... هایدی لەتەنیشت باپیرەی دانیشتبوو، کە بەرەو خوارەوە لەسەر سەرسەرەکە زۆر بە

خێرایی وەك باڵندەیەك لەكاتی فڕیندا خزانە خوارەوە تا گەیشتنە بەردەمی ماڵی پێتەر. ئیتر لەوێ



وەستان.

لە كۆلێتەكەی ماڵی پێتەردا داپیرە كوێرەكەی دانیشتبوو خەریكی دروین بوو.

هایدی سڵاوی لێكردو گوتی: باپیرەم منی بە سەرسەرە هێنا بۆ ئێرە تا سەردانی تۆ بكەم. نازانم گوێت لێمە؟.

داپیرە بە دایكی پێتەری گوت: ئەو كێونشینە*6ئەوی بە ستایشەوە بۆ ئێرە هێناوە.

بۆچی باپیرەم وا ناو لێدەنێیت؟ هایدی بە مەراقەوە پرسی.

لەبەر ئەوەی لە جێگایەكی بچوكی وەك ئەم گوندە خەڵكەكەی هەرچۆن بێت خزمی یەكن. لەبەر ئەوەی ئەو لەو سەركێوە لە شوێنی لەوەڕی بزنەكان ئەژی. ئەو هیچ شتێك لەگەڵ خەلكی ئەم گوندەدا ناكات و زۆر تێكەڵی خەڵكەكە ناكات و دوورە پەرێزی گرتووە لەو بەرزاییە، داپیرە ئەمەی بە خەمباریەكەوە ڕوونكردەوەو پاشان گوتی: بۆ نایەیت لە تەنیشتمەوە دابنیشیت و باسی باپیرەتم بۆ بكەیت، چونكە پێتەر هەندێ شتی نایابی بۆ گێڕاومەتەوە؟.

هایدی لە تەنیشت داپیرەوە دانیشت و دەستی بە قسەكردن كرد، لە پڕێكا دەرگاكە كرایەوەو پێتەر خۆی بە ژووردا كردو زۆر لە هایدی سەری سوڕما!

- ئەوە چییە! دیارە لە قوتابخانە گەڕاوەتەوە؟هایدی پرسی.
- پێتەر چۆن وا زوو هاتیتەوە؟. داپیرەی پرسی.
- ئاخ، هیچ نییە. ئەو پیرەژنە دادو بێدادێتی " پێتەر پێویستە زیاتر بتوانێت بخوێنێتەوە".
- لەسەر ئەو مێزە كتێبێكی كۆنم هەیە شیعری زۆر جوانی تێدایە، كە ماوەیەكە بە هیچ شێوەیەك گوێم لێی نەبووە. من هەمیشە نیازخوازبووم، كە پێتەر ڕۆژێك بۆم بخوێنێتەوە. ئێستا با چراكە هەڵبكەم، چونكە تاریكی كردووە. دایكی پێتەر ئەمەی گوت.

ئەوە باپیرەم هات من بباتەوە، هایدی ئەمەی گوت و بەرەو لای بازیدا. بەڵام پێش ئەوەی بیەوێت دوای بكەوێت دەیخواست بەڵێن بدات، كە جارێكی تر دێتەوە.

زستان بەسەر ڕۆیشت و هایدی بەتەواوەتی لە بیری چووبوو، كە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ماڵێكی تردا ژیاوە!.

چەند ڕۆژێك پاش تێپەڕبوون بەسەر جەژنی هەشت ساڵەی لەدایك بوونیدا، لە ڕۆژێکی زۆر خۆشی بەهاردا لە دەرگاکەیان درا، پاش کردنەوە پورە دێتە خۆی بە ژووردا کرد. باپیرە کاتێك ئەوی بینی سەری سوڕما لەوەی، کە هۆی ئەم هاتنەی ناو ناوە سەردان.

– ئەو کەسانەی من لایان کاردەکەم، خزمێکی زۆریان هەیە، بەم شێوە پورە دێتە دەستی بە قسە کردن کرد: < بەڕێز هێرمان لەگەڵ کچەکەیدا لە خانوویەکی زۆر گەورەو خۆشدا لە فرانکفورت دەژین، بەڵام کچەکەی کەمئەندامە، بۆیە پێویستی بەیەکێکە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هاوکاری بکات، منیش بڕوام وایە، کە هایدی زۆر گونجاوە.

" بەڵام من نامەوێت لەگەڵتدا بێم" هایدی ئەمەی گوت.

– ئەمە زۆر گران نیە، ئەگەر بە دڵت نەبوو، ئەوا دەتوانیت بگەڕێیتەوە. ئێمە بە شەمەندەفەری خێرا سەفەر دەکەین، ئەگەر خواستت، هەر بە خێرایی دەتگەڕێنمەوە بۆ ماڵەوە.

لە کۆتایدا هایدی وازی هێناو ڕازی بوو بە سەفەرەکە. لەناو ئەو دۆڵەی سەر ڕێگاکەیان کە نزیکی ماڵ پێتەر بوو. هایدی هاواری کرد پێتەر من بە سەردانی دەچم بۆ فرانکفورت.



داپیرەی پێتەر گوێی لە دەنگی هایدی بوو، بۆیە هاواری کرد: هایدیمان لەدەست دەرمەکە دێتە !.

پورە دێتەش پێشنیاری کرد بۆ هایدی، کە لە فرانکفورت دیارییەکی جوانی بۆ بهێنێت، پێم وا بێ شیرسەمون*7ی بەناوودەنگە.

هایدی ئەم هزرەی زۆر بە باش زانی، بۆیە گوتی: دەی پەلە بکە، خێرا با بڕۆین، بەڵکو بتوانم ئەمڕۆ سەمونەکەی بۆ بهێنم.

بۆ ڕۆژی دوایی هەر دووکیان گەشتنە ماڵە گەورەکە لە فرانکفورت. سەرەتا بە کلاودیای خانەداری ناساند و پاشان بردی بۆ ژوورێك بە کلارای دوانزدە ساڵانە، کە لەسەر تەختێك ڕاکشا بوو ناساند.

– هایدی تەمەنی چەندە؟ خانەدارەکە پرسی

– من بە تەواوەتی نازانم، بەڵام پێم وایە دە ساڵانە! پورە دێتە وەڵامی دایەوە.

– بەڵام باپیرەم گوتی: کەمن هەشت ساڵانم.

– کەواتە تۆ ئێستا چوار ساڵ لە کلارا منالتریت، خانەدارە ئەمەی گوت و پرسی: تا ئێستا چی کتێبێکی خوێندۆتەوە؟.

– هیچ کتێبێك! من هێشتا فێری خوێندنەوە نەبووم. هایدی وەڵامی دایەوە

– ئەم منالە ئەو کەسە گونجاوە کۆمەڵایەتییە نیە بۆ کلارا!.

کاتێك هایدی و پورە دێتە وویستیان لە ژوورەکە وەدەربکەون، کلارا پرسی: هایدی ئایا بە هاتنت بۆ فرانکفورت خۆشحاڵ بوویت؟.



– نەخێر، سبەینێ ئەگەڕێمەوە بۆماڵەوە.

– بە پێکەنینێکەوە کلارا، ئەزانی تۆ سەیریت. تۆ دڵشکاو بوویت لێرە کاتێك ئەتوویست لەگەڵ من وانە وەربگریت، بەڵام با بزانیت، کە جاری وا هەیە زۆر بێزارکەرە، بەهەر حاڵ دەبێت تۆ خۆت فێری خوێندنەوە بکەیت.

کلاودیای خانەدار گەڕایەوە بۆ ژوورەکە تا کلارا ببات بۆ ژووری نان خواردن. لەسەر قاپێکی تەنیشت هایدی شیرسەمونێکی نەرم دانرابوو. تیمۆی خزمەتچی ئاماژەی بۆ هایدی کرد، کە ئەوە بۆ ئەو دانراوەو دەتوانێت بیخوات، بەڵام هایدی بە پەلە خزاندیە ناو جانتاکەی، چونکە دەیەوویست بۆ داپیرەی پێتەری هەڵبگرێت.

کلاودیای خانەدار دەستی بەڕێك وپێککردنی ماڵەکە کرد، بەڵام هایدی چونکە زۆر ماندوو بوو هەرزوو خەوی لێکەوت، بۆیە خانەدارەکە هات و بردی بۆ ناو جێگای نووستنەکەی..

سبەینێ کاتێك هایدی بێداربووەوەو لەپەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد، لە هەموو لایەکەوە خانووی بەرز بەرزە، هایدی بەمە سەری سوڕما، کە جگە لە خانوو هیچ شتێکی تر نابینێ، نە درەختێك نە کێوێك، خانوو هەموو لایەکی داگیر کردووە.



لەپاش تاشتی هایدی لە تیمۆی خزمەتچی پرسی: مرۆڤ لە کوێوە دەتوانێت دۆڵەکان ببینێت؟.

– لە پەنجەرەکەوە بورجی کلێسایەکی نیشانداو گوتی: ئەگەر بخوازیت دۆڵەکان ببینیت، دەبێت سەربکەویتە سەر ئەو بورجە.

پاش ئەم قسە هایدی ڕۆشتەدەرەوە بۆ سەر شەقامەکەو ڕێگای کڵێساکەی گرتەبەرو سەرکەوتە سەر بورجەکەو سەیری خوارەوەی کرد: جگە لە سەربانی خانووەکان و دوکەڵکێشەکان نەبێت هیچی تری نە دەبینی، بۆیە سەری سوڕماو لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەوە چۆن هەموو وا گۆڕان!.

لەو کاتەدا هایدی دەیخواست لەسەر بورجەکە بێتە خوارەوە، لەسەر قادرمەکان پشیلەیەکی گەورەی بینی لەگەڵ کۆمەڵە بەچکەیەك لەناو سەبەتەیەکدا، ئەمانەش لای ئەو ئەوەندە جوان بوون، وای لێکرد هاوار بکات. ئەرێ کەسێك لێرە لەمماڵەدا نییە.

خزمەتچی کڵێساکە لە گۆشەیەکەوە گوتی: من بۆ خۆم ناتوانم ئەوانە ڕابگرم.

بۆ ڕۆژی داهاتوو، لە کاتی ڕۆیشتنی قوتابیان بۆ قوتابخانە تیمۆ لە خوار ژوورەکەی لای ڕاستەوە، بە سەبەتەیەکی گەورەوە، کە حەوت بەچکە پشیلەی تێدا بوو هاتە دەرەوە، بەچکە پشیلەکان لەناو سەبەتەکەدا تلیان دەدا. بەڵام کاتێك کلاودیای خانەدار ئەمەی بینی بە ئاستەم قاچەکانی هەڵدەهێنا، زۆر تورە بوو، بۆیە تیمۆ لە ترساندا گوتی: ئەمەم بۆ کلارا هێناون و ڕۆشت بۆ ژوورەکەی کلاراو بە کلارای گوت: دەبێت ئێمە جێگایەکی نهێنی و دڵنیا پەیدا بکەین تا ئەم بەچکە پشیلانەی تێدا حەشار بدەین، هەر کاتێکیش کلاودیا لێرە نەبوو دەریاندەهێنینە دەرەوە.



پاش ئەمەو کاتێك کلاودیا تێگەیشت، کە ئەمە کاری هایدیەو ئەو بە نیازی کلاراوە بەچکە پشیلەکانی هێناوە، هەڕەشەیەکی توندی لە هایدی کرد، بەڵام ئەو گوتی: نا، نا با چاوەڕوان بکەین تا بابە بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە.

کاتێك باوکی کلارا لە کار گەڕایەوە، ئەمە زۆر کاری تێکرد، بۆیە یەکسەر ڕۆیشتە لای کلاراو هایدی. پاش سڵاوکردن گوتی: ها کیژۆڵە سویسرییەکە، نازانم بەرگەیان دەگریت یا لەگەڵتدا باشنین؟

– نا، کلارا لەگەڵ مندا زۆر میهرەبانە، هایدی یەکسەر ئەم قسەی کرد.

– وە هایدیش قەت شەڕو دەمەقاڵێ ناکات، کلارا ئەمەی بە پەلە بۆ دڵنیابوون گوت و گوتی: تەنها کلاودیایە سکاڵاو هەڕەشەی تاڵی لێدەکات.

باوکی کلارا وەڵامی دانەوە: ئەگەر کلارا پەیوەندی کۆمەڵایەتی هایدی بەدڵ بێت، ئەوا هایدی دەتوانێت لێرە بمێنێتەوەو ئەمڕۆش دایکم دێت بۆ ئێرە. ئێستا هەموو شتێك تەواوو ڕێك و پێکە.

نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی وەك هەر جارێکی تر دەبوایەت کلارا لە ژوورەکەی خۆی پاڵبکەوێت، بانگی داپیرەی کرد تا هایدی بناسێت، چونکە هایدی زۆر خۆشحاڵبوو. هایدی و کلارا پێکەوە سەیری

کتێبی وێنەیان دەکرد، لەپڕ هایدی لەگەڵ هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکدا وێنەی گوندێکی بچوك، کە کۆمەڵە ئاژەڵێکی لەدەور بوو بینی، ئەمەش یەکسەر فرمێسکی لە چاوەکانی هێنا !.

داپیرەی کلارا، کە ئەمەی بینی دەیەوویست خەمەکەی سارێژ بکاتەوە، بۆ ئەوەی چیتر نەگری، بۆیە گوتی: وەرە با بڕۆین فرمێسکەکانت بسڕیت بۆ ئەوەی بۆم بگێڕیتەوە، کە وانەکەی ئەمڕۆتان چی بوو، دەی بابزانم دەتوانیت کەمێك بخوێنیتەوە؟.

– نا، ناتوانم، چونکە ئەوە ئاسان نییەو زۆر گرانە، پێتەریش زۆری هەوڵدا فێر ببێت، بەلاَم هێشتا ناتوانێت بخوێنێتەوە !.

– من بڕوام وایە، تۆ ئەتەوێت زۆر زوو فێر ببیت، ئەوە نییە کتێبێکت بە دیاری بۆ هاتووە.

پاش کەمێك داپیرەی کلارا زۆر سەری سوڕما لەوەی، کە بینی یەکەمجار هایدی لە ( ا،ب،س) تێنەدەگەیشت، کەچی ئێستا دەتوانێت بخوێنێتەوە !.

سەرلە ئێوارە هایدی لەسەر ئەو مێزەی لێی دانیشتبوو، قاپێك دانرابوو، لەتەنیشت قاپەکەش کتێبێکی وێنەی شکۆدار دانرابوو، بەلاَم کاتێك داپیرەی کلارا دەبوایەت سەفەری بکردایەت، هایدی دەستی بە گریان کردەوە، لەبەر ئەوەی، کە کلاودیا هەڕەشەی ئەوەی لێکردبوو ئەو کتێبە لا بەرێت و سەیری نەکات، بۆیە ڕاچڵەکی و ڕەنگی هەڵبزرکاو دەستی بە گریان کردەوە.

پاش ئەوەی هەفتەیەك بەسەر چوو، شتێکی زۆر سەیر لە ماڵەکەدا ڕوویدا! هەموو بەیانییەك پێش ئەوەی خزمەتچییەکە بێداربێتەوە دەرگای ماڵەکە بەتەواوەتی دەکەوتە سەرپشت. دوای ئەمە زۆری پێناچێت دەگەنە ئەو بڕوایەی لە ماڵەکەدا (ڕۆح)*8ێك هەبێت، بۆیە کلاودیا بەپەلە نامەیەك بۆ باوکی کلارا دەنووسێت و تکای لێدەکات بە پەلەو هەرچۆنێك هەبێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

باوکی کلارا یەکسەر ترسی لێدەنیشێت و وا بۆی دەچێت، کە کلارا لە دۆخێکی ترسناکدا بێت، بۆیە بە پەلە دەگەڕێتەوە بۆ فرانکفورت. یەکەم شەو لەگەڵ هاوڕێ دکتۆرەکەیدا، دەمێننەوەو چاوەنواڕی (ڕۆح)ەکە دەکەن...

ڕێك و دروست کاتژمێر یەکی شەو گوێیان لێبوو لەسەرەخۆ کلۆمەکە*9 پاڵ ئەنرێت و کلیلەکان بۆ خۆیان دەسوڕێن و دەرگاکە دەکرێتەوە !. باوکی کلارا پەلاماری تفەنگەکەی داو ڕۆیشتە پشتەوە، دکتۆریش بەدوایدا.

تریفەی مانگ لەناو دەرگاکراوەکەدا دەدرەوشایەوە، لەپڕێکدا وێنەیەك کەوتە بەچاویان.

– تۆ کێیت؟ بەدەنگێکی ناشازەوە دکتۆر پرسی.

کاتێکیان زانی هایدی بە جلە سپییەکانی خەوەوە لەوێدا وەستاوەو شێوەی ترسێك لەچاوەکانییەوە دیارەو لە ترسانیش هەڵدەلەرزێ.



باوکی کلاراو دکتۆر بەمە زۆر شڵەژان و دکتۆر پرسی: ئەوە لێرە چی دەکەیت؟.

– نازانم! هایدی بە شڵەژاوی وەڵامی دایەوە

– دەبێت من ئەم کیژۆڵە ببەمەوە بۆ ناو جێگاکەی. دکتۆر بە وریاییەوە دەستی هایدی گرت و بردیە سەرەوەو پێی گوت: هیچ مەترسە، بۆم بگێڕەوە بزانم خەوی چیت بینیوە؟

– من هەموو شەوێك لەخەوما، وا دەزانم لای باپیرەمم لە سەر کێوەکە، بەردەوام بە پچڕ پچڕ گوتی: بەڵام کاتێك بێدار دەبمەوە، من هێشتا لە فرانکفورتم.

– ئیتر بەسە فرمێسك مەڕێژەو ترسەکەت لەو کەسانەی بینیتن بڕەوێنەوە، دەی بڕۆ بخەوە ئێستا هەموو شتێك وەك خۆیەتی.

دکتۆر گەڕایەوە بۆ لای باوکی کلاراو گوتی: (ڕۆح)ەکەی ماڵ ئێوە هایدییە! ئەو لەتاو ئازاری نیشتیمانەکەی نەخۆش کەوتووەو هەموو شەوێك لەخەو ڕادەپەڕێ، بۆیە تا زووترین کاتە بینێرنەوە بۆ ماڵەوە.

سبەینێ لەگەڵ هەڵهاتنی هەتاودا، خزمەتچییەکە هەموو شتەکانی هایدی کردە جانتایەك و ئەسپێك و گالیسکەیەکی بۆ ئامادە کرد. کلارا بەم ڕۆیشتنەی هایدی زۆر خەمبار بوو، بەڵام باوکی بەڵێنی پێدا لەهاویندا بینێرێت بۆ سویسرا. لەو کاتەدا، کە هایدی خەریك بوو بڕوات، کلارا دوانزە سەمونی نەرمی پێدا، بۆ ئەوەی بیبات بۆ داپیرەی پێتەر.

ڕێگاکە پێویستی بە ڕۆژو نیوێك دەبوو تا بگاتەوە ماڵەوە. بۆ ڕۆژی دوایی گەشتنە وێستگای شەمەندەفەری گوندێك، کە ئاشەوانی گوندەکە بە ئەسپ و گالیسکەیەکەوە چاوەنواڕی دەکرد. هایدی سواری گالیسکەکە بوو لەگەڵ ئەودا بەڕێکەوتن.

کاتێك گەیشتنە گوندەکە هایدی بە هەورازەکەدا، کە دەکەوتە پێش ئەو ماڵەی پێتەری لێدەژیا بەڕێکەوت. داپیرە بەبێ ئەوەی هایدی هیچ بڵێت، بەدەنگی پێیدا ناسییەوە.

– من هایدیم، جارێکی تر هاتمەوەو نامەوێت بە هیچ شێوەیەك جارێکی تر لێرە دووربکەومەوە.

پاش ئەوەی هایدی ڕۆشتە ژوورەوە، لەبەردەم پیرەژنەکەدا هاتە سەرچۆك و سەمونە نەرمەکانی خستە ناو کۆشییەوەو کڵاوەکەی لەسەری داکەندو دەستی بە داکەندنی جلەکانی بەری کرد، بەتەنها ژێرکراسە قۆڵ کورتەکەی جاران نەبێت، کە پێیەوە بازبازێنی دەکرد.



پاش کەمێك هایدی ڕێگای ماڵەکەی باپیرەی گرتە بەر، کە پێشتر شارەزای بووبوو. کاتێك گەیشتە لای کۆڵیتەکەی باپیری پڕ بە قوڕگی هاواری کرد. باپیرە، باپیرە... بەردەوام بانگی دەکردو هەندێجار پێدەکەنی و هەندێجار دەگریا، باپیرەەە

– هایدی ئەوە تۆیت جارێکی تر بۆ ئێرە گەڕایتەوە !. هایدی باوەشی پێداکردو نامەیەك، کە باوکی کلارا بۆی نووسی بوو سەبارەت بە هایدی دایە دەست.

– لەوبڕوایەدای، کە تۆ تا ئێستا حەزت لەشیری بزنە، زەرکێکی لێوان لێو بەشتدەکات؟. باپیرە پرسی.

لەوکاتەدا هایدی خەریکی خواردنەوەی شیر بوو، لەدەرەوە گوێی لە دەنگی زەنگۆڵە بوو، ئەوە پێتەر بزنەکانی هێنایەوە. کاتێك پێتەر هایدی بینی بەسەر سوڕمانەوە لە جێگای خۆی وەستا. "من زۆر شادمان بووم، کە تۆ جارێکی تر گەڕایتەوە بۆ ئێرە" سبەینێ بۆ لەوەڕاندنی بزنەکان دێیتەوە لەگەڵما؟.

هایدی زۆر بەختەوەر بوو، کە ئێوارە بۆ جارێکی تر لە جێگاکەی لەسەر گزرەکە پاڵکەوت و زۆر قوڵ و باش خەوی لێکەوت.

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تێپەڕی، ئێوارەیەك باپیرەی گوتی: من نەخشەیەکی تەواوم کێشاوە، کە زستان لە گوندەکە ماڵێکت بە کرێ بۆ بگرم، بۆ ئەوەی بتوانیت بە درێژایی سەرمای ساڵ بچیتە قوتابخانە !.

باپیرەی ماڵۆچکەیەکی بۆ گرت و هەموو شتێکیشی بۆ دابین کرد، بەڵام هایدی سەرەتا چونکە ڕانەهاتبوو بە تایبەتیش لەگەڵ سۆپا کاشییەکەدا هەستی بە بێتاقەتی دەکرد.

ماوەیەکی درێژبوو هایدی گوێی لە دەنگی باپیرەیی و باعەباعی بزنەکان نەبوو، بەڵام زۆر بەختەوەر بوو، کە هەموو ڕۆژێك دەچووە قوتابخانەی گوندەکە. هایدی هیچ قسەیەکی لەسەر پێتەر نەدەکرد، کاتێك پێش ئەو ڕۆشتبووە قوتابخانە، بەڵام هێشتا بە دروستی نەیدەزانی بخوێنێتەوە.

ڕۆژێکیان هایدی پێتەری بۆماڵەوە لەگەڵ خۆی برد تا بۆ خوێندنەوە تاقی بکاتەوە، بەڵام ئەو گورج ئەو ڕستانەی هەڵبژارد، کە پێشتر داپیرەی بۆی خوێندبووەوە!.



ساڵ کۆتایی هات و بەفر بەتەواوەتی توایەوە، هایدی گەڕایەوە بۆ کۆڵیتەکەی باپیرەی. ئێستا هایدی ئەتوانێت بزگەلەکە لە ماڵەوە بۆ ئەودیو شاخەکە بۆ لەوەڕاندن ببات.

لە گەڕانەوەیدا ئێوارەیەك بینی نامەیەکی لە کلاراوە بۆ هاتووە، کە لەگەڵ داپیرەیدا دەیانەوێت سەردانی بکەن!. هایدی ئەوەندە خۆشحاڵ بوو نەیدەزانی چی بکات، ئەوە کلارا دێت... کلارا دێت.



بەیانییەك ئەوان هاتن و هەموویان پێکەوە لەسەر ئەو مێزەی، باپیرەی لەدەرەوە لە تەختە دروستی کردبوو دانیشتن.

– ئێرە زۆر خۆشە، هەر بەڕاستی منیش دەمەوێت لێرە بژیم! کلارا ئەم قسەی کرد.

– بەڵێ من ئەتوانم خەمی ئەم کیژۆڵە بخۆم! باپیرەی هایدی ئەم پێشنیارەی کرد.

لەکۆتاییدا گەیشتنە ئەو بڕیارەی، کە کلارا دەتوانێت بۆ مانگێك بمێنێتەوە، ئەمەش هایدی زۆر خۆشحاڵکرد.

ڕۆژ بە ڕۆژ کلارا واز*10ی باشتر دەبوو. تا ڕۆژێکیان هایدی تکایەکی لە باپیرەی کرد، کە ئەوان سبەینێ ناتوانن لەگەڵ بزگەلەکە بچنە دەرێ!. بۆیە بۆ ڕۆژی داهاتوو باپیرەی کورسییە بزوێنەرەکەی*11 هێنایە دەرەوەو گەڕایەوە ژوورەوە بۆ ئەوەی کلارا بهێنێت. لەم کاتەدا پێتەر پەیدا بوو، کورسییەکەی سوڕاندو لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەمە دوژمنمە، چونکە ئەو وەك ئیرەییبەر* 12ێك ئیرەیی بەوە دەبرد، کە هایدی زۆربەی کاتەکانی بۆ کلارا تەرخانکردووە.

"ئەگەر من ئەم کورسییە بەرەو خوار تل بدەمەوە، ئەوا کلاراش لێرە دەڕوات" پێتەر ئەمەی لەبەر خۆیەوە گوت. بۆیە سەیرێکی ئەملاولای خۆیکردو بینی کەسێك دیار نییە، بە هەموو هێزی کورسییەکەی بەرەو خوارەوە خلۆرکردەوە.

کورسییەکە خێراو خێراتر بەرەو خوارەوە تل دەبووەوە، هەتا دواجار کێشای بە گا بەردێکداو بوو بە چەندین پارچەوە.

کاتێك باپیرە، کلارای لەماڵەوە هێنایە دەرەوە، بینی کورسییەکە نەماوە، لەبەر خۆیەوە گوتی: ڕەنگە هەوا هەڵی گرتبێت!.

" هەر بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە! " ئەمەی بە ناوچەوانێگی گرژەوە گوت و ڕۆیشت ڕایەخێکی هێنا، کە کلارا بتوانێت لەسەری دابنیشێت. پاش ئەمەش کەوتە سۆراخی کورسییەکە. بەڵام کلارا هەرچۆنێك هەبێت دەیخواست ئەو گوڵانەی، کەمێك لەسەروی ئەوانەوە لەسەر چیاکە کە تازە پشکوتبوون لە نزیکەوە ببینێت،.

هایدی کاتێك هەستی بەمەکرد بانگی پێتەری کرد، بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات، بەڵام پێتەر سەرەتا ئامادە نەبوو، کەچی پاش کەمێك بیری کردەوە مەسەلەکە وا نییە وەك ئەو بیری لێ دەکردەوە، هەر بۆیە زۆر شەرم دایگرت، بەتایبەتش بۆ کورسییەکە!.

بە هەردووکیان ڕۆیشتنە ژێر باڵی کلاراو زۆر ئاگاداری قاچەکانی بوون، بەڵام کلاراش زۆر بە وریاییەوە هەندێ جارهەوڵی دەدا بۆ خۆی هەنگاو بنێت. سەرەتا کلارا هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد، بەڵام کەم کەم باشتر دەبوو. کاتێك هایدی هەستی بەم هەوڵەی کلارا کرد بۆ ئەوەی زیاتر هانی بدات و نەترسێت گوتی: دەی کلارا مەترسە هەستدەکەم بەك نزیکانە تۆش وەك ئێمە بۆ خۆت بتوانیت ڕێ بکەیت.



– پێتەر گوتی: هایدی ڕاستدەکات، ئەوەتا هێواش هێواش باشتر دەبیت.

کلارا ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەبوو، تا ئەو کاتەی داپیرەی کلاراو باوکی بۆ سەردان هاتنە کێوەکە. پێش هەموو شتێك بۆ هەواڵی تەندروستی کلارا ڕۆشتنە لای باپیرە!.

– باپیرە بە پێکەنینێکەوە گوتی: دیارە لەبەر خۆدانە بەرهەتاوو هەوای پاکی چیا مەرەخەسیتان وەرگرتووە تا بێنە ئێرە، بەڵام بە هەرحاڵ ئەم سەفەرەتان بۆ سویسرا هەواڵێکی خۆشی کتوپڕی پێوەیە.

کاتێك ئەوان بە هەورازەکەدا سەردەکەوتن بۆ سەر چیاکە بۆ لای کۆڵێتەکەی باپیرە، هایدی و کلارا چاویان لێبوو، بۆیە بەپەلە بەرەو کۆڵێتەکە گەڕانەوە.

کلارا باوەشی بە باوکیدا کردو بە چاوێکی گەشەوە گوتی: بابە دەڵێی نامناسیت؟.

– هەر بەڕاستی تۆ کلارا بچکۆلەکەمی؟ لەگەڵ ئەم پرسیارەدا ڕوخساری سور هەڵگەڕا. لەپڕێکا لەژێر درەختەکانەوە خشە خشێك پەیدا بوو، بەڵام باپیرە زوو بینی وا پێتەر بە

دزییەوە بە بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت بۆ لای ئەوان سکەخشەیەتی. پاش کەمێك داپیرەی کلاراش بینی، بۆیە بانگی کرد، هێی کوڕی لاو وەرە دەرەوە هیچ ترسێکیت نەبێت.

پێتەر هاتە دەرەوەو لێیان نزیك بووەوە، بەڵام کاتێك داپیرەی کلارا لێی پرسی: ئەوە چییە، چیت کردووە وا دەترسیت؟. بەڵام زوو باپیرە هاتە وەڵام و گوتی: کاتێك ئەو لەبەر ڕەشەبا بوو کورسییەبزوێنەرەکە بۆ خوارەوە تل بووەوە!.

– کەواتە دەبێت باجەکەی بدات؟ داپیرە بە پێکەنینەوە.

پێتەر کاتێك ئەم قسانەی بەرگوێ کەوت ترسی لێنیشت، بەڵام هەر زوو داپیرە هەستی پێکرد، بۆیە گوتی: ئەگەر کلارا کورسیەکەی لەدەست نەدایەت ڕەنگە فێری ڕۆیشتن نەبوایەت!. هایدی یەکسەر بە پێکەنینەکەوە هاتە وەڵام و گوتی: ئێستا ئەو هەر کاتێك بخوازێت لەگەڵ ئێمەدا دەتوانێت بێت بۆ سەر چیاکە.

هایدی چیتر ناتوانیت کێوە خۆشەویستەکەی بەجێ بهێڵێت، بەڵام وەك ئەوەی کلارا پەیمانی دابوو، هەمووساڵێك لە هاویندا سەردانی دەکرد، وە پێتەریش لەبەر ئەوەی ئیتر وازی لە ئیرەیی هێنابوو پێکەوە هەر سیانەکەیان بوو بوون بە هاوڕێکەیەکی زۆر دڵسۆزی یەکتر.

فەرهەنگۆك

*1- گزرە: ئەو گیایەی بۆ زستان بۆ لەوەڕی ئاژەڵ هەڵدەگیرێت.

*2- زەرك: جامی لەمس دروستکراو، دەفر،قاپ

*3- شێو: ژەمی خواردنی ئێوارە

*4- تاشتی: قاوەڵتی، بەرقلیان، خواردنی بەیانیان

*5- سەرسەرە: ئەو گالیسکەی لەسەر بەفر دەیئاژوون

*6- کێونشین: لێرە مەبەست کەسێکە ماڵی لە سەرکێوە

*7- شیرسەمون: ناوی جۆرە سەمونێکە، بەشیر دەشێلرێت

*8- ڕۆح: تارمایی، خێو، پەری

*9- کلۆم: قفلێ\کلیلی دەرگای دارین

*10- واز: ئارەزووکردنی خواردن، ئیشتها

*11- کورسی بزوێنەر: مەبەست لەو کورسییانەیە، کە تایبەتە بە کەسانی نەخۆش

*12- ئیرەییبەر: کەسێکی حەسود

## پەراوێز

*1 یۆهـەنا شـپیر Johanna Spyri ژنـە نووسـەری سویسـری لـە12.7.1783 لـە هیرتسـەل Hirzelی سەربە کانتۆنی زیوریخ هاتۆتە دونیاوەو لە 1859کۆچی وایی کردووە.

## سەرچاوەکان


1– Heidi .Übersetzt aus dem Englishen von Wiebke Diederichs, Hamburg. Illustrationen. Jennz Press

2– www.heidi-film.de

3– www.heidi01.ch